# بۆ خۆشەویست

## چۆرێک وەفا

هۆنراوە

قاسم گەلاڵی

ربیع الاول/١٤٣١ شوباتی/٢٠١٠

پەرتووك : بۆ خۆشەویست چۆرێك وەفا .

نووسینی : قاسم گەلاڵی .

تیراژ : (٥٠٠) دانە .

ساڵی چاپ : ٢٠١٠ .

چاپ : یەكەم .

كاری كۆمپیوتەر و دیزاینی بەرگ : یوسف هەریری.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانەكان ژمارەی سپاردنی (         ) ساڵی ( ٢٠١٠ ) دراوەتێ .

# ( دەروازەی یـــــاد )

لە دەست پێك و لە دەروازەی ئەم یـــــادەوە

بە دڵێکی زۆر خۆشحاڵ و بە دەرونێکی شادەوە

گشتمـــــــــــــان دڵمـــان خۆشەو دەڵێین

سوپاس بۆ خـــــــــوا ، بەڵێن ، بـــەڵێن

تـــــا تەمەنمان لە ژیان مابێ هـــەموو ساڵێ

یـادت دەکەین بە دەرمانی ئـــــەو دەردانەی

بـــە هیچ کەس و هیچ دکتۆرێ چـــــارە نابێ

# لەم یـــــــــادەدا

لەم یادەدا من نازانم

چۆن بێمە گۆ

تا بێمە دووان

بۆ خۆم بۆ تۆ

دەگێرنەوە گوایە کەسێ

ویستی یوسف بۆ خۆی بکرێ

نەقدی دەستی هێندە کەم بوو

هەرگیز لە کڕیار نەدەچوو

کاتێ لێیان پرسی ووتی

من دەزانم کە یوسفم پێ ناکڕێ

بەڵام دڵم گەلێ خۆشە

که ناوی من

له لیستەکەی کڕیارانی

یوسفی جوان

تۆمار بکرێ

منیش لێره چاك دەزانم

که ناتوانم

لەم یادەدا

پڕ به دڵ وەفا دەربڕم

بەڵام دڵم خۆشه کەوا

بۆ خۆشەویستی پێغەمبەر

لەم مانگەدا شتێ بچرم

## (ئەی محمد) (ﷺ)

تۆ سەروەری

پێغەمبەری

هەر تۆ مامۆستای

بەشەری

شایستەی

سورەی کەوسەری

...............

پێش هاتنت پێغەمبەر

ڕێگا نەبوو بۆ بەشەر

ژین مانای لە دەست دابوو

ڕێزی مرۆڤ نەمابوو

تۆ هاتی ژیان گۆڕا

خۆشەویستی لێ چۆڕا

فێرت کردین مانای ژین

چۆن بەرەو بەرزیی بچین

خواویستی و خۆنەویستی

ڕەفتارت بوو کێ ویستی

ئێمەش بێ فەرامۆشی

دڵان دەخە ینە خۆشی

# هەردوو بەهـــــــار

بەڕێزان و خۆشەویستان

ساڵان دێن و ساڵان دەڕوا

زستانیش وەك جاری جاران

ڕوومەتی خاك زۆر جوان دەشوا

خاکیش ئاوی باران دەخوا

تاکو بەهار بێتە بەرهەم

تا گژو گیاو دارو درەخت

هەر یەك بۆ خۆی خۆی نیشانداو

بە ئارامی بڵێ من هەم

..............................

بەڵام ئەمساڵ هەردووبەهار

لەگەڵ مانگی خۆشی و ئازار

دەست لەملانن زیاتر جوانن

بەهارێکیان گیانی ژیانە

ئەوی تریان ژیانی گیانە

ئەمساڵ لەگەڵ یەکەم شەوی

مانگی بەهاری یەکەمدا

مانگی ئاسمانی وەك کەوان

به زمانی حالْ دێته دووان

به زمانی حالْ پێمان دەلێ

ئایا ئێوه من دەناسن

یا له باسی مندا کاسن

من خۆمتان پێ دەناسێنم

دیدو دلْتان دەتاسێنم

مانگی بەهاری یەکەمم

مانگی لابەری گشت خەمم

مانگی یادی پێغەمبەرم

یادی بونەکەی سەروەرم

مانگی سورەتی قورئانم

له سەرەتا وەك کەوانم

دواتر دەبمه بەدری ڕوناك

تاریکی لادەبەم له خاك

مانگه شەوێ دادەهێنم

دلەکانتان دەهەژێنم

من هەروا بوم

تاکو یاران له کۆچەکەی پێغەمبەردا

بەدری منیان به ئەو شوبهاند

بۆیە منیش ئەدەب دەکەم

هەر بە بەدری بمێنمەوە

هەموو مانگێ لە دوای چواردە

خۆم ناگرم و دەتوێمەوە

بەڵام فێربووم لە گشت مانگێ

سرودەکەی دڵی یاران

لە سێ شەودا بڵێمەوە

# لەگەڵ کێ دا دەست پێ بکەم

لەگەڵ کێ دا دەست پێ بکەم

لەگەڵ نێرگز یاخود خوناو

لەگەڵ مانگ یا خاکی تێر ئاو

لەگەڵ شنەی هەوای بەهار

یاخود لەگەڵ بەفری نسار

لەگەڵ دڵانی پڕ بە فەڕ

بۆ خۆشەویستی پێغەمبەر

لەگەڵ یادی ئەشکەنجەو ژان

یاخود لەگەڵ (فەتحی) دڵان

لەگەڵ یەکەم ووشەی قورئان

کە دابەزی بۆی لە ئاسمان

لەگەڵ میعراج و کۆچی ئەو

یاخود لەگەڵ فرمێسکی شەو

که دەڕژێتە سەر ڕوی سیا

تاکو سپی و جوانی بکا

بەشکو لەم یادە بخوێنێ

هەر وەکو کەو وێنەی دوێنێ

من نازانم لە چ خاڵێ دەست پێ بکەم

لە دەرگای دڵی گشت ماڵێ

لە تەهلیلەی خاوەن حاڵێ

لە تەسبیحی دەستی پیرێ

صەلاواتت بۆ دەنێرێ

لە ئاوازی هونەرمەندان

بوێرانە وان لە مەیدان

لە وەصف و مەدحی شاعیران

یا لە فرمێسکی قەتیس ماو

لە چاوی مناڵ و پیران

لە شاشەو دەنگی یەکگرتوو

یا لە فەرهادی پەککەوتوو

کە هۆنیەوە سیرەتی توو

لە پاقلاوەی بەخشراوی

کوچەو کۆلان

کە بۆ یادت دێتە گەڕان

ئەی خودایە

تۆ بەخشندەی

تۆ بەهێزو گەلێ گەورەی

ئەو رەحمەتەت

کردە دیاری

بۆ ئێمەی موحتاج و هەژار

تاکو دلمان بگرێ قەرار

# لە ژێر سێبەری

# ســـــــورەتی (الاعلی)

لە ژێر سێبـــــەری سورەتی ئەعـــــلا

داعـــــی دەدوێنرێ بە تاقی تەنیـــــا

جارێ بــــــە (سبح) بۆ یـــــادی خودا

(فذكر) بۆ خــــــەڵك تا نەبێ جـــودا

گەشـــــتی خواناسی بــە نێو (مخلوقات)

ئاســــانكارییە ژ بۆ تەسبیحـــــــات

ئامــــــــادەباشی داعـــــی بۆ كارێك

بــە بێ لە بیرچون ئاســــان بە جارێك

لەولاوەش خـــــەڵكی دابــــــەش كراوە

لــــــە پێشدا تەواو سەربەســـت كراوە

بە نەهج و پەیـــــام بە ژیری ناوســـەر

بۆیـــــــە (من یخشی) پاڵفتە كـــــراوە

(أشقی) لـــــە ڕۆژی (عدل)ا ســـــوتاوە

خۆ نەدۆڕاندن بردنــــــەوەی تا ســــەر

بە یەك شت دەكـــــرێ مرۆڤی ڕەنجدەر

قۆناغـــــەكانی ژیانت لــــــــە بەربێ

كە جێت هێشت یەكێ بۆ دواى بە بەر بێ

نـــــــــــــــەك دیتنی ژین نەبینینی ژیان

تێری جەستەیی و بـــــــــــــرسێتی بۆ گیان

ئێرە و ئەوێندەر هاوكـــــــــــــات ببینە

ئێرە جێ ی كارو ئەوێش كـــــــــــاردینە

بۆیەش لە (اعلی) (ایثار)ی دونیـــــــــــــــا

بە ســـــــــــــەر ئاخیرەت مەشەقەت دەدا

كـــــــــــــــەوابێ ئەوێ (خیر) و (أبقی)یە

سەنگی مەحەكیش ئێرەی دونیایـــــــــــــە

بۆیەش ئەم دیدە كاكڵەی پەیـــــــــــــامە

نەگۆڕی (صحف)ی موسی و ئیمـــــــــــامە

# زمانحاڵی مێشهەنگێك

منم منم مێشەنگینم

خاوەنی جوڵەی بەتینم

له قورئاندا سورەتێکم به ناو بووه

وەك (انبياء) به (اوحى) ئەمرم هاتووه

ژیانی ئێمه به کۆمەڵە تەنهاییم پڕ زیان و ژانه

داعیش ئەگەر به تەنها بێ وەکو جەستەی بێ گیانه

من و داعی له یەك ئەچین

بۆیه قورئان باسم دەکا

هەرسێ شێوازی بانگەواز له مندایه

داعیش  ئەبێ له یاد نەکا

بەرهەمی من هەنگوینی ساف و شیفایه

هی داعیش قورئانی بەرزه

شیفای دەردی خەڵکی تیایه

بۆیه نەحلم بێ بەرامبەر زۆر دەبەخشم

وەکو داعی بەردەوام خەریکی نەخشم

## ئەی پێغەمبەر

بیست و سێ ساڵ ڕەنجت کێشاو

ماندوو نەبووی لە گەیاندن

گەیاندنی ئیمان بە دڵ

ناساندنی مرۆڤ بە گڵ

دەرچواندنی نەوەی تازە

لە هەناوی کۆمەڵگایەك

لە نەزانین وێنەی شازە

## ئەی پێغەمبەر

ئێمەش هاتووین وێنەی یاران

هەروەك باران

لە بەری ڕەنج و شەكەتیت

دڵۆپ دڵۆپ بچینە سەر

خاکی تینووی هەموو دڵان

تاکو لە ژێر سایەی قورئان

بە جێ بێنین ئەرکی خۆمان

لەم زەمان و لەم زەمەنە

لە پاڵفتەی ئەم تەمەنە

قوربانی پەیامەکەت کەین

قەرزاری تۆ لە خۆ سوك کەین

## ئەی پێغەمبەر

قانع قوربانی خامەی بوو

تا بۆت بێتە گفت و گوفتار

بۆ نوسینی مەدح و وەصفی

سەیید و ئەحمەدی موختار

..........

مەحویش لە عیشقی تۆ دابوو

بەحری نوری کوردی کردە

باڵای بردە بەژنی بوردە

..........

بێخودیش دڵی لێ وون بوو

تا لە شاری تۆ دۆزیەوە

ئینجا تێ گەیشت کە ماوە

دڵی ئەوەو نەفەوتاوە

..........

پیرەمێردیش  رۆحی فڕی

بۆ یادەکەت ووشەی چڕی

...........

مەولەویش وەك ئەندازیارێ

بۆ میعراجی کەم کاتی تۆ

زاری ووشەی لێ دەبارێ

**ئەی پێغەمبەر**

پیرێکی ئەم پیرە شارەش

کە بیستی غیرەتی جولا

فریای پێلاوی نەکەوتوو

بە پێ خواسی دڵی کولا

............

ئەڵقەی دەفی دەستی دەروێش

خۆشەویستی تۆ گەرمی کرد

لە چواردەی دوو بەو سەرمایە

رۆحی کەوتە ئەو سەمایە و

نارەزایی گەرمتر کرد

## ئەی پێغەمبەر

ئێمەش هاتوین وەك ریبۆاریٚ

بە کاروانی هەلگرانی

پەیامەکەت هێواش هێواش

گوزەر دەکەین دێینە خواریٚ

جوان دەبینین وەکو خاتەم

سەرقافلەی کاروانی خێری

لە سەرە مەرگ و وەفاتدا

وەك ئەمانەت پەیامەکەت

بە ئێمەی ئوممەت دەسپێری

ئێمەی برات نەماندیوی

لەگەڵ یارانمان دەژمێری

بۆیە لێرەش

سەدان هەزاری ئەم شارەش

لە جیاتی هێنانی ناوت

بە خۆشەویست ناوت دەبن

ئامادەشن: بە ڕاستیانە

خۆیان بە دایك و باوکەوە

قوربانی ڕێگاکەت دەکەن

............

## ئەی پێغەمبەر

وزەو ورەی خەباتی من

ئەی ئەمینی پەیامی من

ئەی سەرمەشقی شاکاری من

ئەی وەرگری قورئانی من

ئەی سەییدی سەرداری من

ئەی ئەحمەدی موختاری من

ئەی خەڵاتی پەروەردگار

بۆ ئێمەی موحتاج و هەژار

ئەی رحمه للعالمین

بۆ گشت مرۆڤی سەرزەمین

یادی بوونت هێندە بەرزە

لە دوای چواردە سەدە هێشتا

فرمێسك لە چاوان دەهێنی و

دڵان دەهێنیتە لەرزە

## ئەی پێغەمبەر

چەند دیقەتی ژیانت دەدەم

شەرمەزاری خەباتی تۆم

هەرچەند یادت تەمەن دەکا

هەولّی خەمی ڕازێك دەخۆم

دێتە بیرم قیامی تۆ

خەمی شەوانی خۆم دەخۆم

کە دەزانم  خواناسیی تۆ

هەولّ دەدەم بە فرمێسکم

ژەنگی دلّم زۆر جوان بشۆم

یادی بون و وەفاتی تۆ

خەمی قورئانەکەت دەخۆم

چەند پەڕۆش بوی بۆ قەومەکەت

منیش خەمی قەومم دەخۆم

تا لە یادی لە دایك بوون

جارێکی تر بێینەوە بوون

^^^^^^^^^^^^^^^^^^

## ئەی خـــــــــودایە

لە سەحەری ئەم شەوەدا

دڵی تێنوم

بە ناسینت

تێر ئاو بکە

تاکو داری

ژیانی گیانم

بەردار بکات

............

**ئەی خودایە**

هەوری چاوم

ڕاگرە لە سەر

خاکی دڵم

تا بە جوانی

وەکو باران

بیشواتەوە

تاكو ڕۆحم

تامەزرۆبێ و

بۆ شوێنی خۆی

بڕواتەوە

**ئەی خودایە**

من تامەزرۆی

کڕنوشێکم

لەم سەحەرە

پڕ لە فەڕە

تاکو لەگەڵ ئەستێرەکان

بەندایەتیم

بسەلمێنم

تا لە ڕۆژدا

لە کاروانی بەندەکاندا

جێ نەمێنم

..........

**ئەی خودایە**

منی بەندە

دڵم بەندە بە فەرمانت

بۆیه نەفسم پالفتەیەو

ڕۆحیشم هەردەم بە خەندە

بەڵام زۆر جار

شەیتانی هار

دەخزێتە ناو

دەریای دڵم

لێم دەخوێنێ و

دەمترازێنێ

کە من گڵم

......

## ئەی خودایە

من هاوارم

هەر بۆ تۆیە

ڕۆحی ماندوم

بە ناسینت

تامەزرۆیە

چونکە غەیری

(تواب)ی تۆ

پەنجەرەیەك

شك نابينم

ئەگەر هەشبێت

هەرلاچۆیە

هەر بڕۆیە

بێ ئومێدی و

بێ چارەیە

کەچی یادت

چارەسەرەو

پڕ لە بەرە

حەسانەوەی

رێبواران و

هەلگرانی پەیامەکەی

پێغەمبەرە..

# ناوەڕۆك

## له كـــــــــــــۆتایی دا:

بۆ شاری هەولێری بە وەفا بۆ خۆشەویست دەڵێم

پایتەختەكەی بێ كیـــــــان

چیرۆكی مێـــــــژووی ژیان

ئەی نیـــــــشانەی كۆڵنەدان

خـــــــاوەن دوینی سولتان

ئەی نیشتمـــــــانی هەموو

باخـــــــەوانی شەشی دوو

یاقووتی تـــــــاجی مێژوو

پاڵەوانی چـــــــواردەی دوو

شارەكەم شـــــــاری بەڵێن

مەردی هۆلاكۆ بـــــــەزێن

شاری شەوانی قـــــــەدر

ڕاپەڕیو دژی غـــــــەدر

دڵخۆشکەری نـــــەخۆشان

ئەی دەڵـــــیلی خێرخوازان

ڕابردووی پـــــڕ پاڵەوان

لە موفتی تـــــا خولەکان

ئامێزەکەی جـــــەژنیکان

بۆ هەڵەبجەکەی کـــــوردان

بوی بە هـــەوێن بۆ بێ خەو

بتهۆنێتەوە بـــــە شەو

شـــــاری شکۆو سەربەرزم

مـــــن دەنگێکی نەلەرزم

چاکـــــسازی یە ئاوازم

کەی تۆ شاد بوی من شـــادم